زنجيره توێشوى بانگخوازان 37

# زمانى خۆت بگره



وەرگێراني
حاجى عبدْ الجليل

عمر عبد الكافي





چاپى يەكەم

زنجیره تویێشوی بانگخوازان: ٣٧

بسم الله الرحمن الرحيم

# زمانی خۆت بگره

دانانی

د. عومەر عەبدولکافی

وەرگێڕانی

حاجی عەبدولجەلیل

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێب: زمانی خۆت بگرە

بابەت: پەروەردەی ئیمانی

نوسەری: د. عمر عبدالكافي

وەرگێڕانی: حاجی عبدالجلیل

پێداچونەوەی: م. مەلا فتحي زراری.

تایپ ونەخشەسازی وبەرگ: زیلان عبد الجلیل

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٨ز-١٤٢٩ك

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٠٥) ساڵی (٢٠٠٨)ی دراوەتێ

کتێبخانەی مەحوی

هەولێر بەرانبەر قەڵات بازاری ڕۆشنبیری — تەنیشت تاپۆ/ ٠٦٦٢٢٢٣٦٥٠ .

## بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

سوپاس وستایش بۆ ئەو خودایەی کە قورئانی بەسەر بەندەکەی خۆی دابەزاندووە، وهیچ نارێکی یەکی تیا نەکردوە، پاکی وبێ گەردی هەر بۆ ئەو خوایە وبانگخوازی ڕاستیش هەر بۆ ئەوە کە بە تەنگەوەیە ومژدە پێ بەخشینی واجب وپێویست کردوە: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ال عمران: ١٠٤.

واتە: پێویستە لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێت یان با هەمووتان ئومەتێك بن کە بانگخوازای بکەن بۆ چاکە وفەرمان بکەن بە هەموو کارێکی دروست وباو وقەدەغەی هەموو نادروستیەکان بکەن ئا ئەوانە سەرفرازن. "ت.ئاسان"

شایەدی دەدەم کە (الله) تاکە وهیچ هاوبەشی* نیە وبەڵگەی داناوە وتەواو ڕاستەڕێی کردوە. ﴿وَيَأْبَى اللَّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَو كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ التوبە: ٣٢.

واتە: خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی، هیچی دیکەی ناوێت بێجگە لەوەی ئایین ونوری خۆی سەر باخات، وتەواو دیار بکات وهەرچەندە گاور وکافرەکان پێی سەخڵەت بن ودڵ تەنگ بن. "ت.ئاسان"

شایەدی دەدەم کە سەروەر وخۆشەویستمان محەمەد ﷺ نێردراوی خوایە: هەروەها پەیام وڕاسپاردەکەی گەیاندوتە جێ وئامۆژگاری خەڵکی کردوە، وتەم ومژی لاداوە، هەتا ڕۆژی کۆچی دوای بۆ خوا تێ کۆشاوە، خوایە گیان تۆش درودی خۆت وصەڵاواتی لەسەر لێ بدە هەروەها وێڕای کەسوکار وهاوەڵان وهاوسەر وشوێنکەوتوانی کە باوەڕیان پێی هێناوە وباوەڕیان بە

ستەمکاری دانەپۆشیوە وبەڕاستی ئەوان دڵنەوایی وهیدایەتی خودایان بووە.

ئیدی: موسڵمانانی بەڕێز نیعمەتی خوای گەورە لەسەرمان هەژمار ناکرێ وکۆتایی نایە. ﴿وان تعدوا نعمة الله لا تحصوها﴾ ابراهیم: ٣٤.

واتە: ئەگەر نیعمەت وبەخششەکانی خوا بژمێرن نایەتە هەژماردن

هەروەها مانەوەی نیعمەتیش بە شوکرانە کردنی خاوەنی بەندە وئەگەر ئەتەوێ نیعمەتەکان بەسەرتدا ببارن وبەردەوام بن ئەوە سوپاسگوزاری خاوەن نیعمەت بکە، هەروەها یەکێك لە شوکرانەکان ئەوەیە کە نیعمەتەکان لە سەرپێچی خودا بەکار نەهێنی، جا ئەگەر سامانی پێ دای لەحەرام مەیچوێنە، وئەگەر زانستی پێ بەخشی لە ئازاردانی خەڵکی بەکاری مەهێنە، وئەگەر دەسەڵات وهێزی دای ئەکەی لە سنوور

بەزاندن بەكاری بهێنی، وئەگەر لەش ساغی دایی قەت لەسەرپێچی خودا بەكاری مەهێنە، كەوایە هەر نیعمەتێك پێویستە بۆ ئەوە بەكار بێت كە بۆی تەرخان كرایە، وەرە سەرنج بدە نیعمەتێك كەوا مرۆڤ فەرامۆشی كردووە ولە خەیالیدا نیە، تەنها ئەو كەسە نەبێ ئەگەر لێ بێ بەش بێ ئەویش (زمانە).

لە ڕووی كاری ئەندامیتی (زمان) شەش فەرمانی هەیە: ئەویش تام كردن، شیرینی وتاڵی، ترشی، سوێری، هەست بە ساردی وگەرمی خۆراك وپێ زانین.

جا سەرنج بدە كەسێك نیعمەتی تام كردنی نەماوە، لە شتێك نازانی كە ئایا شەكرە یان هەنگوین یان خۆراكی شاژنی تێدایە یان سوێرە یان بەهاراتی تێ كراوە!.

جا تۆ بە هۆی ئەم هەستی تامكردنەوە هەر چەندە خۆراكت خوارد بێ وتامت پێ كردووە، ئایا سوپاسی خوات لەسەری كردووە كە نیعمەتێكی چەندە

پێویستە؟! بەلاَم لەلایەن گفتوگۆوە سەرنج بدەن چۆن زمانمان بەكار دەهێنین! ئەگەر دەتوانی ڕۆژانە سەعاتێك لە قسەكانت تۆمار بكە، نیو سەعات لە ماڵ ونیو سەعاتیش لە سەر ئیشەكەت، پاشان وەرە سەرنج بدە قسەكانت بزانە چەندە قسەت كردووە، بزانە چیت بە برادەرەكانت وبەڕێوەبەر وخاوەن كارگەو خاوەن كۆمپانیای دز گوتووە... هەروەها دەربارەی ئەوەی ریبا دەكا ومامەلە بە حەرام دەكات و ئەوەی دوو ڕووە... گوێ بدە قسەكان وبڵێ: ئەگەر قسەكانی خۆم بنێرم بۆ فریشتەی چاكە نوس وفریشتەی تاوان نوس دەبێ چەند قسەم بچێتە لای فریشتەی گوناح نوس؟ وكامیان بیان نوسێ؟ خۆت دەبینی كەوا كەم لە قسەكانت دەچێتە لای فریشتەی چاكەنوس تەنها لەو كاتەی نوێژ دەكەی بە چاكە لە لاپەڕێك دەنوسرێ.

وەلێ تاوان نوس: غەیبەت ودوو زمانی وباسی ناموسی خەڵك وشایەدی ناحەق وقسەی جرِنا وفرِنا وسنور شکاندن وسوێندی درۆ ئەمانە هەمووی دەچنە تۆماری تاوانەکان، لەخوا داواکارین زمان پاك وخاوێنمان بکا.

بەلاّم لە بەرانبەر ئەم کارەش سەیر وسورهێنەرەت سەرنج بدەنە بونەوەرە بێ زمانەکان کە خوای گەورە توانای زمانی قسەی پێ نەداینە، کە بەستەزمان قسە دەکەن تێ ناگەین، ئایا کەسمان گوێی لە دەنگی میرولە بووە کە قسە لەگەڵ جیرانەکەی دەکات؟ نەخێر.

بەلاّم خوای گەورە ئەم پەردەیە بۆ حەزرەتی سلێمان سەلامی خوای لێبێ لا دابوو کاتێك لە شارە مێرووستانەکە گوێی لە مێرولەکە بوو توشی شۆك هات کە مێرولە ژیرەکە بە مێرولەکانی خۆی دەگوت: ﴿یا ایها النمل ادخلوا مساکنکم لا یحطمنکم سلیمان وجنوده وهم لا یشعرون﴾ النمل: ١٨.

جا قسەی میرولەکە ئاگاداری وئامۆژگاری وقەدەغە کردن بوو، گوتی ئەی مێرووەکان بڕۆنەوە ناو شارەکەتان ئەمەش: هۆشیاری دانە بۆچی؟ چونکە لەشکرەکە وسلێمان سواری ئەسپەکان بوون، جا ئایا سوارچاکی بەوەیە کە داخۆ پێ لە مێروولە دەنێن یان نا، بەلاّم مێرولەکە هەستی بەمە کرد بۆیە هۆشیاری وهۆشداری ورێنمای هاوەڵەکانی کرد، خۆ ئەگەر وایان کردبایە نە بەئەنقەست ونە بە ئاگایی لێ بوون ونە بەمەبەست بوو.

هەندێك لە تەفسیرەکان دەڵێن سلێمان پێکەنی وبە مێرولەکەی گوت: چ شتێك وای لێ کردی کە ئەم داوایە لە هاوڕێکانت بکەی؟ مێرولەکە گوتی: لەوە ترسام نەوەك مێرولەکان ڕاوەستن تەماشای هەیبەت وسامی سەربازەکان وسوارەکان بکەن وزیکری خوای گەورە بۆ ساتێك لە بیر بکەن.

کەواتە کە مێرولەکە قسەی کرد قسەی خێری کرد هەر چەندە بۆ ئێمەش نەبووە قسەیان لەگەڵدا بکەین، وتێیان بگەین بەلاًم سلێمان ئەم بەهرەی هەبووﷺ یان چوونی پەپو سلێمانە بەرەو باشوور وبەرەو یەمەن، پەپوەکە چوو وگەڕاوە وهاوەڵی سلێمانی کرد لە (بەیتلمەقدس) وهەرەشەی کرد وپەیمانی دا، فەرمووی یان سەری دەبڕم یان سزای دەدەم ئەگەر بە گلەییەکی ئاشکرا نەێیت، ئەگەر پاساوی نەبا دوو جۆرە سزای هەبوو، چونکە لە شوێنی پاسەوانیەکەی بزر بوو وبەجێی هێشتبوو.

ئەوەی خوا بەخشیبویە سلێمان سەلامی خوای لیبی لەهەموو جیهانیان بە کەسی نەدابوو، کاتێ لەسەر کورسیەکەی دادەنیشت لە لای ڕاستەی جنۆکەکان ولای چەپی شەیتانەکان، ودرندەکانیش لە بەرانبەری ڕادەوەستان، وهەر هەموویان بە فەرمانی وی کاریان

دەکر، هەروەها دەسەڵاتی بەسەر باشدا هەبوو بۆ لای ڕاست وچەپ بە ئاسانی کاری پێ دەکردن.

جا پەپوەکە گەڕاوە وقسەی کرد هەر چەندە ئێمە لە زمانی تێ ناگەین، هەروەها هەموو بونەوەرەکان قسەیان لەگەڵی دەکرد، بەزمانێك بەڵام ئێمە تێیان ناگەین بەڵام حەزرەتی سلێمان خوا فێری کرد بوو وتێی دەگەیشت ﴿احطت بما لم تحط به وجئتك من سبإ بنباء يقين  اني وجدت امراة تملكهم واوتيت من كل شيء ولها عرش عظيم  وجدتها وقومها يسجدون للشمس من دون الله وزين لهم الشيطان اعمالهم فصدهم عن السبيل فهم لا يهتدون الا يسجدوا لله يخرج الخبء في السماوات والارض ويعلم ما تخفون وما تعلنون﴾ النمل: ٢٢-٢٥.

واتە: وتی ئەوەی من پێم زانیوە تۆ پێت نەزانیوە من لە وولاتی سبەئەوە هەواڵێکی ڕاست ودروستم بۆ

هێناوی، من بۆم دەرکەوت ئافرەتێك فەرمان ڕەوایی دەکات کە هەموو دەسەلأت وناز ونیعمەتێکی پێ بەخشراوە وتەختێکی پاشایەتی گەورەی هەیە، دیتم خۆی وقەومەکەی سوژدە بۆ خۆر دەبەن لەبری خوا، شەیتان کردەوەی چەوتیانی بۆ ڕازاندۆتەوە، بەو هۆیەوە ڕێی ڕاستی لێ بزر کردون، بۆیە ڕێنمووی وەرناگرن، شەیتان ڕێی لێگرتوون بۆ ئەوەی سوژدە بۆ ئەوە خوایە نەبەن کە نهێنی دەر دەخات، چ لەئاسمانەکان وزەوی دا دەزانی چی دەشارنەوە وچیش ئاشکرا دەکەن.

واتە پەپوەکە باسی یەکتاپەرستی و ووشەی لا الە الا اللە ی کرد، ئایا پەپوەکە لە ئێمە زیرەکترە؟ ئایا میرولە لە ئێمە عاقڵترە؟

## چیرۆکی ئەهبان وگورگەکە

ئەهبان شوانێکی جولەکە بوو لە مەدینە بە شوانکارەی دەرچوو بوو، گورگێکی لێ پەیدا بوو، مەڕەکی لێ قەپاند (فڕاند) ئەهبان کەوتە دووی، ومەڕەکانی بە جێ هێشت، گورگەش چووە سەر گردێك (بڵندایەیەك) پاشان مەڕەکەی بەڕەڵا کرد، گوتی: ئەی ئەهبان ئایا ڕزقێك لەمن قەدەغە دەکەی کە خوا بەمنی دایە؟ ئەهبان سەری سوڕما (تەماشای لای ڕاستە وچەپی) کێ یە قسە دەکا؟ ئایا لە پشت گورگەکە کەس هەیە ئەو دەگە لە کێ هات؟ ئایا لە رزقی خۆم قەدەغەم دەکەی؟ کاتێ شوانەکە دڵنیا بوو کەوا دەنگی گورگەکە بوو، زۆری سەراسیمە بوو! سەری سوڕما، گورگەکە قسەی کرد، گورگەکە گوتی لەمەش سەیرتر ئەوەی پیاوێك هاتووە قسە بۆ خەڵکی دەکات دەربارەی ڕابردوو وداهاتووش دەزانێ ئەگەر بڕوای پێ بینی دەچیە

بەهەشت، شوانەکە یەکسەر گورگ ومێگەلی بە جێ هێشت وگەڕایەوە مەدینە، ئایا هیچ پیاوەك هاتووە بێجگە لە دینی جولەکە باسی ئایینێك بکا؟ گوتیان بەڵێ: محەمەدی کوڕی عبدولاَ لەمەککەوە هاتووە ووا مزگەوت دروست دەکا، شوانەکە چووە لای ولەکاتی بینا کردنی مزگەوتێ دا بوو یەکسەر لێی نزیك بۆوە، خۆشەویست ﷺ ڕاستەوخۆ پێی گوت: ئەی ئەهبان گورگەکە چی پێ گوتی؟ یەکسەر شوانەکە موسڵمان بوو بێ سێ ودوو... دەبێ گورگەکە چی گوتبێ؟ ئایا باسی پارە وسامان ودۆلاری کرد یان کۆشك وتەلار ومامەڵە؟ نەخێر، باسی پرسێکی گرنگی کرد، باسی پرسی پەیامێکی کرد، باسی شتێکی پیرۆزو خێری کرد.

یان سەفینە ڕەزای خوای لێبی کە هاوەڵی خۆشەویست ﷺ بوو، لە خزمەتی کاری دەکرد لەو کاتەی لە تەبوك دەهاتنەوە، تەبوك (٢٧٨٠) کیلو مەتر دوور بوو، سەرنج

بدە دوورییەکە، واتە ئەمڕۆ بە فڕۆکە بە سەعاتێك دەیبڕی، جا ئایا ئەگەر بە کەر یان ئێستر یان ئەسپ یان بە پێ بیبڕی دەبێ چەند بێ؟ سەفینە لە غەزاکە بزر بوو کەتە بیابانی کاکی بە کاکی لە خوا پاڕایەوە. هەر ئەوەندەی دیت، شێرەکی لێ پەیدا بوو، ددانی ڕیچکردەوە وسەفینە لێی نزیك بۆوە بە شێرەکەی گوت: من خزمەتکاری پەیامبەری خودام ﷺ، شێرەکە چی کرد؟ کلکی لەقاند واتە ڕەزامەندی ودڵنیای نیشاندا بەردستی کرد (دەستەمۆ بوو) هەتا سەفینەی گەیاندەوە کاروانی پێغەمبەر ﷺ وگەڕایەوە جێی خۆی.

بەڵێ شێریش بە وشەی (من هاوەڵی پێغەمبەرم ﷺ ڕام بوو وهۆگری کابرا بوو) یان ئەو حوشترەی کە لە ژێر دیوارێکی مەدینەدا لە باخچەیەك پێغەمبەری دیت دەربارەی پرسیار دەکات کە هی کێ یە؟ گوتیان ئەم

حوشتره هی گەنجێکی ئەنصاره وفەرمووی کوا؟ گوتی: ئەوەتەم منم، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەرانبەر ئاژەڵەکانتان لەخوا بترسێن ئەو حوشتره وا شکایەتت لێ دەکا، لەسەر ئەوەی توانای باری نیه ولێ بار دەکەی، هەر کەس ڕەحمی نەبێ ڕەحمی پێ ناکرێ وڕەحم بەوانەی سەر زەوی نەکات خواش لە ئاسمان ڕەحمی پێ ناکات، ڕەحم بەوانەی زەوی بکەن خواش ڕەحممان پێ دەکات.

لەو کاتەی مەریەم سەلامی خوای لێبی دووگیان بوو منداڵی بوو، خزم وکەسی هاتن وگوتیان: ﴿یااخت هارون ما کان ابوك امرأ سوء وما کان امك بغيً فاشارت اليه....﴾ مريم: ٢٨-٢٩.

واته: ئەی مەریەم تۆ ئەباوکت کەسێکی خراپ بوو ئە دایکیشت ئافرەتێکی داوێن پیس بوو، مریەمیش هیچی

نەگوت بەڵکو ئاماژەی بۆ منداڵەکەی کرد (تا لێ ی بپرسن).
عیسا ساوا بوو هێشتا قسەی نەدەکرد، جا ئاماژەی بۆ کرد یەکەم وشەی گەورەمان عیسا قسەی چی گوت؟ بەچی بە زمان هات؟ گوتی ﴿قال اني عبد الله اتاني الكتاب وجعلني نبيا﴾ مريم:٣٠.
واتە: عیسا گوتی من بەڕاستی بەندەی خوام ئینجیلی پێ بەخشیوم ومنی کردووە بە پێغەمبەری خۆی. "ت.ئاسان"
کەواتە بە بەندایەتی دەستی بە قسە کرد یان بە یەکتاپەرستی وبەندایەتی ویان بە زیکری خوا قسەیان کردووە وبە شێوازێکی ناسروشتی بە زمان هاتوونە.
جویج ڕاهیبێکی بەنی ئیسرائیلی بوو، کە خۆشەویست ﷺ بەسەرهاتەکەی دەگێڕێتەوە وئافرەتێك دەچێتە لای ودەیەوێ لە خشتەی ببات، بەڵام ئەو پیاوە خوا

پاراستی وڕازی نەبوو، ژنەکەش لە داخان گوتی: شەرت بێ حەیات ببەم، جا پاشان چووە لای شوانێك وزینای لەگەڵ کرد وزگی لێ پەیدا بوو کاتیك قەوم وکەسی لێیان پرسی، ئەم ساوایەت لە کێ بوو؟ ژنەکە گوتی: لە ڕاهیبی (جویج) لا حول ولا قوه الا بالله، جا چوونە سەری ودێرەکەیان ڕووخاند وڕاهیبیان ئازاردا گوتی: کوا منداڵەکە و ساواکە وتازە بووەکە؟ جا ساوایەکەیان هێنا وڕاهیب دەستی لەسەر زگی داناو گوتی: ئەی منداڵ کێ باوکتە؟ منداڵەکە بە زمان هاتوو گوتی بابم شوان کارەی مەڕانە.

جا داوای لێ بوردنیان لە ڕاهیبەکە کرد وگوتی دەبێ دێرەکەت بۆ بەزێڕ تازەو چاك کەینەوە، بەلاّم بە قوڕ بۆیان چاك کردەوە وئێمەش لە قوڕین.

کەواتە هەر هەموو ئەوانەی بە زمان هاتوون پێش ئەوەی زمان بگرن کە قسەیان کرد بێ یان بە حەق یان

بە ڕاستگۆی یان بە یەکتاپەرستی بە زمان هاتینە، ئێمەش هەر لە تەمەنێ سێ یان چوار ساڵی کە خوا نیعمەتی زمانی لەگەڵماندا کردیە وهەتا سەر دەنێینەوە خوا نیعمەتی زمانی لەگەڵماندا کردووە، جا ئایا ئەم زمانەمان چۆن بە کار دەهێنین، ئایا سوپاسی خوامان لەسەر ئەم زمانە کردووە؟ بێگومان بێ دەنگی لە زێڕە، (زمانی بڕاوە سەری حەساوە)، کەواتە ئەگەر قسەت کرد قسەی چاك بکە ئەگەر نا بێ دەنگ بە سەلامەت دەبی.

خوایە گیان لە هەردوو جیهان زمان سەلامەتمان بکەیت ئەی پەروەردگاری جیهانیان، یان لە باسی ئەو چوار چۆلەکەیە کە حەزرەتی سلێمان سەلامی خوای لێبی چاوی پێیان کەوت لەو کاتەی جیوە جیویان بوو، وسلێمانیش لەگەڵ لەشکرەکەی دابوو وپێیانی گوت: دەزانن ئەم چۆلەکانە چی دەڵێن؟ گوتیان: نەخێر،

فەرمووی ئەم چۆلەکانە قسەی سەیر دەکەن، سلێمان گوتی: یەکەم چۆلەکە دەڵێ خۆزگە دروستکراوەکان دروست نەکرابانە، دووەم چۆلەکە دەڵێ: خۆزگە کە دروستیش کران بیان زانیبایە بۆچی دروستکراون.

﴿وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون﴾ الزاريات: ٥٦.

واتە: من جنۆکە ومرۆڤم خەلق نەکردووە تەنیا بۆ بەندایەتی نەبێ.

سێیەم چۆلەکە گوتی: خۆزگە زانیبایان بۆچی خولقاون وکاریان بە زانینەکە دەکرد، چوارەم چۆلەکەش دەڵێ: خۆزگە ئەگەر کاریان کرد بەوەی کە زانییان خۆزگە بە دڵسۆزی کارەکەیان دەکرد، سبحان الله دڵسۆزی، دڵسۆزی لە مەبەستەکدا تەنها بۆ خوای پاك وبێ گەرد، دڵسۆزی لە نیازدا بۆ خواو بە بڕوایەکی پتەو، حەزرەتی سلێمان میرولەیەکی لە ناو شوشەبەندێك دانا و لەسەر داوای خۆی دوو دەنکە گەنمی بۆ خستە ناو شوشەکە، گوتی

ئەوەندە بەشم دەكات ئەی پێغەمبەری خودا بۆ درێژی سالێك جا شوشەكەی بەسەردا پێوەدا.

پاش سالێك دیتی وا تەنها دەنكەك گەنمی خواردوە ودەنكێكی ماوە، پێی گوت دیارە درۆم لەگەڵدا دەكەی ومن پێغەمبەری خودامە، مێرولەكە گوتی نەخێر. بەلاَم لەو كاتەی رزقم لەسەر خودا بوو دوو دانە گەنمم دەخوارد بەلاَم هەر كە رزقەكەم كەوتە دەستی تۆ گوتم تۆ مرۆڤی نەوەك لە بیرم بكەی بۆ رۆژێك دەمخوارد ورۆژێك بە رۆژوو دەبوم، بۆیە دەنكەكەم خوارد ودەنكێك ماوە.

كەواتە ئەوە بەراستی پشت بەخوا بەستانە، راستگۆیی. راستی ئەوەی كە تۆ مەخلوقی ورزق دەدرێی لەلایەن خوای جیهانیان ئەگەر بیەوێ، نەكەی پەلە پەل بۆ رزق بكەی، رزق بە پەلە كردن نیە، رزقت بۆ دێ هەروەكو چۆن مردن دێت، كەوایە مەسەلەكە ئەوەیە متمانەت

بەخودا بێ، وەلێ زمانەکەت چاك بکە، نێوان هەردوو شەویلاکت بگرە وتێری کە، دڵەکان خەزێنەن زمانیش کلیلەکەیانە ولێوەکانیش قوفلەکانن، دوو لێوەکان گوزارشت لە قوفل دەکەن کە کلیلەکان دەکەنەوە وکلیلەکانیش لە دڵەکان وەردەگیرێن، جا کەوایە کلیلەکان بە چاکی بە کاربهێنن تا ببینە لا کەرەوەی چاکە وداخستنی خراپە،

لە حەسەنی بەصریان پرسی بۆچی قسە کەم دەکەی، وئێمە زۆر قسە دەکەین؟ فەرمووی: پێش ئەوەی قسەیەك یان ڕستەیەك بڵێم بە عەقڵم دەڵێم: جا ئەگەر دیتم قسە دەچێتە سەر تەرازووی چاکەم قسەکەم دەکەم، وئەگەر زانیشم قسەکەم دەچێتە سەر تەرازووی تاوانم نایکەم، جا ئەگەر دیتتان بێ دەنگم ئەوە بزانن قسەکەم چاك نیە وبێ دەنگم دەبینن، ئەوە لەو کاتەدا یاد وزیکری خودا دەکەم، بۆیە خۆشەویست

ﷺبێ دەنگی بیر کردنەوە بووە ودوانی زیکر بوو وچاو پێداخشانیش (سەیر کردنی) پەند وەرگرتن بوو.

پەنجا ساڵ پێش ساڵی ١٩٤٨ لە کۆنگرەی (بالی) جولەکەکان گوتیان پاش پەنجا ساڵی دی وولاَتێك بۆ جولەکە لە فەڵەستین دادەمەزرێ، جولەکەکان پەنجا ساڵ بێ دەنگ بوون، ئەوجا پاش پەنجا ساڵ وولاَتەکەیان هاتە دی لە فەڵەستین. بۆچی؟ چونکە جولەکە کار دەکەن وکەم قسە دەکەن، ئەگەر کەسێك زۆر قسەی کرد ئەوە بزانە کردەودی کەمە وشتێك ناکا، بەلاَم ئەوانەی کەم قسان دەکەن زۆر کار ددکەن.

بۆیە موسڵمان دەبێ کەم بلێ وزۆر گوێ بگرێ وکار بکات بۆ ئەوەی تەرازووی چاکەی سەنگین بێ، خوایە گیان زمانمان لە قسەی پوچ بپارێزی، خوایە گیان ئەو زمانەمان بە شەو ورۆژ بە خێر ویادی خۆت بگەڕی.

قسە بەندەی خۆتە ئەگەر درکاندت تۆ دەبیە کۆیلەی ئەو جا چەندان قسە هەیە دەبێتە مایەی ماڵکاولی خێزانەکان وئاسەواری قەت ناسڕێتەوە، بەیەك تاکە ووشە لە خاڵێك یان مامێك لە کاتی توڕەیی دەگوترێ قەت لەبیر ناکرێ، (برینی نەشتەر چاك دەبێتەوە بەلاّم برینی ووشە تیمار نابێ).[1]

خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ربما یتکلم العبد بکلمة لا یلقی لها بالاً بلغت من رضوان الله، انها ادخلته الجنة، وربما یتکلم العبد بالکلمة لا یلقی لها بالاً بلغت سخط الله انها ادخلته النار.

واتە: ڕەنگە بەندە قسەیەك بکات گوێشی پێ نەدرێ بەلاّم بۆ ڕەزامەندی خوا بێ وئەو قسەیە بیباتە بەهەشت وڕەنگە قسەیەکیش بەندە بیکات گوێی پێ

---

[1] وەرگێر.

نەدرێ ببێتە مایەی تورەیی خوا، پێ بچێتە ناگری دۆزەخ.
وشەیەك، توخوا وشەیەك کە گوزارشت بە یەکتاپەرستی یە گوزارشت لەچی دەکا؟ زانایان دەڵێن: هەر کەسێك بێتە ناو ئیسلام واتە موسڵمان ببێ، دروست نیە موسڵمان بوونەکەی هەتا وشەی شەهادەی یەکتاپەرستی واتە لا الە الا اللە نەڵێ. جا ئەگەر بڵێ (لا الە الا الرحمن) نابێتە موسڵمان یان (لا الە الا الرحیم) (الا الە الا الغفور، الودود، الشکور، الصبور) هەرگیز نابێ تەنها بە لا الە الا اللە دەبێ.
دەگێڕنەوە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە دەڵێن: بەندەیەکی خوا لە ڕۆژی قیامەت تەرازووی چاکەی سوك دەبێ واتە تاوانی زۆرە جا پێغەمبەر ﷺ لە گێڕانەوەیەك دەفەرمووێ فریشتەیەك بە دەستێ وپارچە نوسراوێك فڕێ دەداتە سەر تەرازووی چاکەی

ئەو بەندەیە بەوەش چاکەی زۆر دەبێ ولا تەرازووی تاوانی سوك دەبێ بەهۆی ئەم نوسراوە یان ئەم پسولەیە، ئەوجا بانگدەرێك بانگ دەدات: فلانی کوڕی فلان ڕزگاری بوو چیدی بەدبەخت نابێ ئەو پیاوە ڕزگاری دەبێ، جا بەندە هەیە زمانی پێ ناگیرێ دەڵێ ئەو پسولەیە چی یە؟ دەڵێن: لەم پسولەیە نوسراوە کە جارێك گوتویەتی لا الە الا اللە، خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ هیچ شتێك لە ناوی خودا گران وسەنگین تر نیە... هیچ... هیچ.

لە ناخی دڵتەوە بڵێ لا الە الا اللە، بەداخەوە دزیش دەڵێ لا الە الا اللە و خوایە بمپارێزە، هەیە دزی دەکات وخیریشی پێی دەکات! هیچ بەخوا بێجگە لە پیستر بوونی زیاتری بۆ نیە، جا ئەوەی دەمەوێ بیڵێم، موسڵمان جار هەیە بایەخ بە وشەیەك نادات، ئەم نموونە بگرە، هەیە دە ساڵ یان بیست ساڵە هاوسەر

گیری کردووە بەلاَم هەر کە ناخۆشیەك لەگەڵ خێزانەکەی ڕوو دەدات بە ژنەکەی دەڵێ: پێم گوتی برایەکت زۆر ڕەزای گرانە، کە هات وا دەزانم عەرد قوتم دەدا، ژنەکەی پێی دەڵێ: بۆچی؟ ئەو تۆی خۆش دەوێ جا بە ژنەکەی دەڵێ: حەز لە چارەی ناکەم، ژنەکە دەڵی لەبەر چی؟ کابراش دەڵێ: ئەوە بیست ویەك ساڵە کە هاتم بۆ خوازبێنیت لاقی لەسەر لاقی دانا بوو وبەمنی گوت: تۆ ئەو کەسە نی کە خالەکەت لە زێراب ئیش دەکات؟ مەسەلەکە زێرابە!! زێراب ئەم هەموو ڕك وقینە! تەنها لەسەر یەك قسەیە، نەیەکەم باکی بەقسەکەی بووە ونە دووەمیش لە بیری دەکات!!

بەڵێ ئەوە یەکە لە گرفتەکانی موسڵمانان لەم ڕۆژگارەدا، دەپرسم: ئایا بۆچی ئێمە بایەخ بە قسە نادەین ونرخی نازانین؟

وەلاّم: چونکە ئێمە نازانین لە کێندەر هەڵدەگیرێ وبەرەو کوێ دەڕوات، پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿مایلفظ من قول الا لدیه رقیب عتید﴾ ق: ١٨

واتە: هەر قسەیەك لە دەم دەرچێ یەکسەر چاو دێرێکی ئامادە تۆماری دەکات.

فریشتەی چاکە وخراپەنوس لە کاتی درکانی قسەی خراپ دوو میل لەبەری هەڵدێن ودەڵێن ئای لەو بۆگەنیەی لە دەمت دێ، خوایە بمان پارێزی لە قسەی خراپ.

جا توخوا ئەگەر فریشتەکان لەبەرت هەڵبێن دەبێ ێ بێتە لات؟ شەیتان بێگومان شەیتان لوتی لەسەر دڵی ئادەمیزاد دادەنێ ئەگەر یادی خوا بکات وشەیتانەکە فس دەبێتەوە، بە زیکری خودا شەیتان کپ دەبێتەوە. بەلاّم ئەگەر غافل بوو ئەوە شەیتانەکە بەکار دەکەوێ

ولە خشتەی دەبات، بەتایبەتی ئەگەر مرۆڤ هەڵەو پەلەشی زۆر بوو زیاتر شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ.
جا کەوایە برای موسڵمان خوشکی جوان: لە کاتی قسە کردنت بیری لێ بکەوە بە تایبەتی لە ماڵێ ولە ناو خەڵك ولەکاتی ڕەفتارت لەگەڵ کەسوکارەکەت ولە ناو کۆر وکۆبونەوەکان زۆر بیر لە قسەکەت بکەوە ئەوجا بیدرکێنە.
لێرەدا تەنها مەبەستم یەك سوود وقازانجی زۆر بە نرخە: پێتان دەڵێم: ئەویش ئەوەیە: بەڕێزەکەم: لەقسەی چاکە کردن درێخی مەکە چونکە سوودت پێ دەگەیەنێ ودەچیتە سەر کردەوەی چاکەکانت، پاداشتی خۆت بە قسەی خراپ مەچووێنە بە غەیبەت وپاشە ملە ودوو زمانی (خوا پەنامان بدات)
بەخوا زۆر لە خوشکان پێیان دەڵێم ئێوە بەڕاستی چاك وپاکن. جا ئەی ئەوەی یەکەم جار دەچی دەیخوازی

ودەبێتە هاوسەری ژیانت وبە درێژایی هەموو ژیانت لەگەڵتدا دەبێ نەکەن زەمی یەکدی بکەن وماف یەکتری پێشێل بکەن ونەکەن لە نرخی یەکدی کەم بکەنەوە وجوێن بە کەسوکاری یەکدی بدەن!!

خوایە گیان لەو کەسانەمان بگێڕی کە زمانیان دەپارێزن

•

وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

هەولێر

و/عەبدول جەلیل

بەهاری ساڵی ٢٠٠٨

**لە نوسراو و وەرگێردراوەکانی نوسەر کە چاپ کراون نەمانەن**

١- بەسەر هاتی تۆبەکاران

٢- چاکسازی دڵان

٣- پەروەردەی ڕۆڵەکان وناسودەیی خێزان

**٤- توێشوی بانگخوازان کە چل ﴿٤٠﴾ دانە نامیلکەیە:**

١-پەیامێك بۆ کچانی زانکۆ.

٢- تا ببیتە بەختەوەرترین کەس.

٣- دادگای دادپەروەری.

٤-چۆن دەبیتە موسڵمان؟

٥- چۆن ورە بەرز دەکەی؟

٦- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

٧- نەخۆشیەکانی دڵان.

٨- شەمەندەفەری ڕۆژگار

٩-ئیسلام بەبێ ناینزا.

١٠- ژیر وبێ ئاگا.

١١- لە نهێنیەکانی قورئان

١٢- ترس وتکا.

١٣- لێبوردەیی.

١٤- سەلیقە.

١٥-بەروبومەکانی گوێڕایەلی.

١٦- بەروبوومەکانی زیکر.

١٧- سوپاسگوزاری ونزا.

١٨- پەیینی بەختەوەری.

١٩- دڵپاکەکان.

٢٠- چارەسەری ڕك وحەسودی.

٢١- نزاو نوێژ.

٢٢- زیکری ڕاستەقینە.

٢٣- گوێڕایەڵی وسەرپێچی خودا.

٢٤- پەندی مردن.

٢٥- ژیانی دڵان.

٢٦- مردنی دڵان.

٢٧- حیکمەتی تاقیکردنەوەی خودا.

٢٨- هاوسەرگیری سەرکەوتوو.

٢٩- ڕوو وەرگێڕانی خودا لەبەندەی.

٣٠- تەنگی ونهێنیەکان.

٣١- بەربەستەکانی وەرگیرانی خوا پەرستی.

٣٢- پیاوان تەنیا چوار جۆرن.

٣٣- براوە ودۆڕاو.

٣٤- سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

٣٥- کات

٣٦- لەعەمرە پیشەوەی شارەزا بوون بەرپرسیاری یە.

٣٧- زمانی خۆت بگرە.

٣٨- تورە مەبە.

٣٩- هیوا درێژ.

٤٠- ئایا پیشەکەی خۆت لەبیر چووە؟

-بەربەستەکانی وەرگیرانی خوا پەرستیەکان.

-پیاوان تەنیا چوار چینن.

- براوە ودۆڕاو.

- سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

-کات.

-لەهەرە پێشەوەی شارەزا بوون بەرپرسیارێتی یە.

- زمانی خۆت بگرە.

-تورە مەبە.

-هیوا درێژی.

-ئایا پیشەکەی خۆت لەبیر چووە؟